د. عائض القرني

# ٣٠
# نیشانەی مونافیقان

وەرگێڕانی

نەوا محمد سعید



2008

# ( ٣٠ )

# نیشانەی موناfیقان

نوسینی

د. عائض عبدالله القرني

وەرگێڕانی

نەوا محمد سعید



ناوی نامیلکە: ٣٠ نیشانەی مونافیقان
نوسەر: د. عائض القرني
وەرگێرانی: نەوا محەمەد سەعید
بلاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر بۆ بلاوکردنەوەو راگەیاندن/ هەولێر
نەخشەسازی ناوەرۆک: جمعە صدیق کاکە
نەخشەسازی بەرگ: أمین مخلص
نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم ١٤٢٩ك – ٢٠٠٨ز
تیراژ: ٢٠٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردنی (١٧١٤)ی ساڵی ٢٠٠٨ پێدراوە



بۆ بلاوکردنەوە و راگەیاندن
هەولێر- شەقامی دادگا - ژێر تونێلی شیرین پالاس
ت: ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٢٠٩٠٨- ٢٥١٨١٣٨
مۆبایل ٠٧٥٠ ٤٦٠٥١٢٢ - ٠٧٧٠ ١٣٨ ٧٢ ٩١
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

بسم الله الرحمن الرحيم

## پێشەکی

سوپاس وستایش بۆخوای پەروەردگار، هەزاران درودو سلاو برژێ بەسەر پێغەمبەرو هاوەڵانیو شوێنکەوتوانی تا ڕۆژی دوایی.

لەڕاستیدا دەردو نەخۆشی مونافیقی، لە هەموو دەردو نەخۆشییەکی تر لەسەر دڵ و دەرون کاریگەرترە، کە چارەنوسی ڕۆژی دوایی مرۆڤ دیاری دەکات، ئەمرۆش لەبەر پابەند نەبوونی خەڵك بەبەندەکانی ئیمان و نەبونی تەقوا، سیفەتێکی زۆربڵاو تەشەنەکراوە لە کۆمەڵگادا، کە لەم نامیلکەیەدا (سی) نیشانەی مونافیقان لەژێر تیشکی قورئان و سوننەتی پێغەمبەر ﷺدا باسکراوە،

کە دەبێ مسوڵمانان بەیارمەتی خوا خۆیان لێ دوورە پەرێزبگرنو نەهێڵن ئەم نیشانانە لەخۆیان بێتە دیو تەشەنە بکات.

هەروەها دەبێ ئەم نیشانانە لە خۆشم بەرجەستە نەبێ لە خوای باڵادەست داواکارم ئەم کاری وەرگێڕانەم بۆ بکاتە مایەی سودمەندیی بۆڕۆژی دوایی و سەربەرزی هەردوو ژین.

وەرگێڕ

١٩٩٣/١٠/٦

## بەشەکانی دوو ڕوویی( النفاق )

نیفاق لای ئەهلی سوننەت و جەماعەت دەکرێت بەدوو بەشەوە:

بەشی یەکەم: نیفاقی بیرو باوەڕ، ئەم جۆرە نیفاقە مرۆڤ لەکۆمەڵی مسڵمانان دێنێتە دەرەوە و خاوەنەکەی لەژێرەوەی ئاگری دۆزەخ دا دەبێت، وەك خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ إِنَّ الْمُنَافِقِينَ فِي الدَّرْكِ الأَسْفَلِ مِنَ النَّارِ﴾[النساء:١٤٥]، واتە: (بەڕاستی دووڕووەکان لەچینی هەرە خوارەوەی ئاودۆزەخدان). مونافیق ئەو کەسەیە، کە بەشاراوەیی پەیامی پێغەمبەر(ﷺ)کە دینی خوایە بەدرۆ دەخاتەوە، یان کتێبەکانی خوا و فریشتەکان، یان هەربنچینەیەك لە بنچینەکانی ئەهلی سوننەو جەماعە بەدرۆ دەخاتەوە، خوا دەفەرموێ: ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن يَقُولُ آمَنَّا بِاللّهِ وَبِالْيَوْمِ الآخِرِ وَمَا هُم بِمُؤْمِنِينَ(٨)يُخَادِعُونَ اللّهَ وَالَّذِينَ آمَنُوا وَمَا يَخْدَعُونَ إِلاَّ أَنفُسَهُم وَمَا يَشْعُرُونَ(٩)فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَهُمُ اللّهُ مَرَضاً وَلَهُم عَذَابٌ أَلِيمٌ بِمَا

كَانُوا يَكْذِبُونَ﴾[ البقرة: ٨ـ ١٠ ]، واتە: (لەناو خەڵکیدا کەسانێك هەن کە دەڵێن: ئیمان و باوەڕمان بە خوا و ڕۆژی قیامەت هەیە، (لەڕاستیدا ئەوانە درۆدەکەن) هەر گیز ئیمان و باوەڕیان نیە، ئەوانە (بەخەیاڵی خۆیان وا دەزانن)خواو ئەو کەسانە دەخەڵەتێنن، کە باوەڕداری ڕاستەقینەن!! بەڵام هەست ناکەنو فام ناکەنەوە بیر ناکەنەوە ئەوانە لە دڵو دەروونیاندا دەردو نەخۆشی (حەسوودیو کینەو ڕق و لە مسوڵمانان) هەیە، خوایش (بەسەرخستنی حەق و ئیمانداران) ئەوەندەی تر دەردیان کاریگەر دەکاتو سزایەکی سەختیش (لە دونیاوقیامەتدا) چاوەڕێیانە بەهۆی درۆکردنو (دژایەتی یان بۆ ئیسلام).

بەشی دووەم: نیفاقی کردەوە: وەك: پێغەمبەر ﷺ لە صەحیحەیندا دەفەرموێ: ((آية المنافق ثلاث: إذا حدث كذب، وإذا وعد أخلف، وإذا أؤتمن خان)). واتە: (سیفەتی مونافیق سێیە: گەر قسە بکا، درۆ بکات، گەر بەڵێنیدا، بەڵێنەکەی نەباتە سەر، ئەر

شتێکی لادانرا یان پێ سپێردرا خیانەتی تێدا بکات).

جا ئێستا (سی) سیفەت لەسیفەتەکانی مونافیقان دەخەینە ڕوو:

## نیشانەی یەکەم: درۆکردن:

ئیبن تەیمیە دەڵێ: درۆکردن ڕوکنێکە لە ڕوکنەکانی کوفر. هەروا دەڵێ: خوای گەورە کە لە قورئان باسی نیفاق دەکات، یەکسەر لەگەڵ ئەو وشەیە باسی درۆ دەکات، بەهەمان شێوە گەر باسی درۆبکات لەگەڵ ئەم وشەیە باسی نیفاق دەکات، وەك دەفەرموێ: ﴿وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَكَاذِبُونَ﴾، واتە:(خوا شاهیدە کە ئەو ناپاك و دووڕوانە باوەڕیان بە تۆ نیە)، جا گەر درۆ بەشێوەی سوعبەت یاراستی بکرێت، یا بۆ فێڵ یا بۆ ئەنجامدانی کارێك، ئەوا لقێکی (نفاق) دووڕوویی یە.

## نیشانەی دووەم: ناپاکی کردن لە پەیمان دا:

بەڵگەش لەسەر ئەمە فەرموودەی پێغەمبەرە، کە دەفەرموێ: ((...وإذا عاهد غدر)) رواه البخاري. جا هەر کەسێك پەیمان بداتە مسوڵمانێك، یا کافرێك یاکارێکی پێ بسپێردرێ، پاشان خیانەتی تێدا بکات، ئەوا شایەتی نیفاق لەسەر خۆی دەدات.

هەروەها کەسێك پەیمان بەژنەکەی، یان کورەکەی، یان هاورێیەکەی بدات پاشان بەبێ هەبوونی عوزری شەرعی بەجێ ی نەگەێنێ و خیانەتی تێدا بکات، ئەوا کردەوەیەکەی دەبێتە رِوکنێك لە رِوکنەکانی نیفاق.

## نیشانەی سێیەم: بەجێ نەگەیاندنی بەڵێن( وەعد ):

هەرکەسێك بەڵێن بەبرای مسڵمانی بدا و پاشان لەکاتی خۆیدا بەجێ نەگەێنێ. یان کەسێك بەڵێنی پێ

دای لەکاتی دیاری کراو وەك لەکاتژمێر ئەوەندە، یان ڕۆژێك یان فڵانە شوێن، پاشان بەبێ عوزر بەڵێنەکەی بەجێ نەهێنا، ئەوا بزانە ئەوکەسە لقێکی مونافیقی تێدایە.

## نیشانەی چوارەم: تەمبەڵی کردن لەعیبادەت:

وەك خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ إِذَا قَامُواْ إِلَى الصَّلاَةِ قَامُواْ كُسَالَى﴾[ النساء: ١٤٢] واتە: (مونافیقان گەر بۆ نوێژکردن هەستن، بەسستی و تەمبەڵیەوە هەڵدەستن).

جا گەر کەسێکت بینی بۆ نوێژکردن، یا بۆ ڕیزی پێشەوە، یان لەزیکر کردن، یان لە بانەگەوازی بۆ ئیسلام یان لە کۆڕی خێرو چاکەدا تەمبەڵی و سستی دەنواند، بزانە ئەوکەسە وەسوەسەی لەنەفسی دایە، شەیتان دەیەوێ هێلانەی تێدا دروست بکات، بائاگاداری خۆی بێ، ئەو کەسەی دوو ڕکعات نوێژ دەکات، مانای وانیە لە مونافیقی بەدوورە، چونکە مونافیقەکانی سەردەمی

پێغەمبەر لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ نوێژیان دەکرد، بەڵام نوێژەکەیان بەتەمبەڵیەوە ئەنجام دەدا.

## نیشانەی پێنجەم: ڕیایی کردن لەعیبادەتدا:

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿يُرَآؤُونَ النَّاسَ وَلاَ يَذْكُرُونَ اللّهَ إِلاَّ قَلِيلاً﴾[النساء : ١٤٢] واتە: (ئەوانە ڕیایی و ڕوپامایی بۆ خەڵکی دەکەن، زۆر کەم یادی خوادەکەن). بابزانین ڕیایی کردن چۆنە؟ ڕیایی کردن ئەوەیە، کە لەپێش چاوی خەڵك خۆی دەردەخا، گوایە بەتەقوایە، کەبەتەنهاش نوێژ دەکات بەخێرایی ئەنجامی دەدا، کە لەکۆڕو مەجلسێك دادەنیشێ، ئەدەب و عیبادەت و زوهدی تێدا بەدی دەکرێ، بەڵام کە لێیانەوە دادەبڕێ بەپێچەوانەوە ڕەفتار دەکا. هەرکارێك یان قسەیەك دەکات لەپێناو خەڵکی دەکاتو ڕیایی دەکات، ئەمەش لە نیشانەی مونافیقی یە.

هەروا ڕیایی بە شیرك دادەنرێ، وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: ((الرياء شرك)) رواه أحمد بسند جيد و إبن ماجه.

## نیشانەی شەشەم: بە پەلە نوێژكردن:

وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: ((تلك صلاة المنافق....يقرأ أربع ركعات))أخرجه مسلم. نوێژكردن بەخێرایی، كە هیچ مل كەچی و ترسی خوای تیانەبێ، هەروەها كەم مانەوە لەنوێژدا، كەم زیكرو یادكردن لەنوێژو نەبونی هەیبەت و بیمی خوای گەورە لەدڵ دا نیشانەی مونافیقانە.

## نیشانەی حەوتەم: كەم یاد كردنی خوا:

مونافیقان یادی خوا دەكەن، بەڵام بەكەمی وەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلاَ يَذْكُرُونَ اللّهَ إِلاَّ قَلِيلاً﴾ [النساء:

١٤٢]، واتە: ( زۆربەکەمی یادی خوا دەکەن) جا خـوای گەورە نەیفەرمووە یادی خوا ناکەن، بـەڵکو فەرموویـەتی یادی خوابەکەمی دەکەن.

لە (ئیبن صلاح)یان پرسـی کـە بـە محدثی شـافعی دادەنـرێ، سـنوری یـادی خـوا چـیە؟ ئـەویش گـوتی: هەرکەسـێك ئـەو زیکرانـە بخـوێنی کەلـە پێغەمبـەرەوە وەرگـیراون، ئـەوا زیکـری خـوای زۆر کـردووە. هـەروەها هەرکەسێك زیکرەکانی پـاش نوێـژی بـەیانی و ئێـواران و زیکرەکانی خواردن و خواردنەوە و هەستان لەخەوو بینینی بروسکە و باران و چوونە نـاوو هاتنـە دەرەوەی مزگـەوت بخوێنێ، ئەوا یـادی خـوای زۆرکـردووە. باشـترین کتێبـی زیکر کردن (الأذکـار)ی نـووی و (الوابـل الـصیب)ی إبـن القیم و (الکلم الطیب)ی ئیبن و تەیمیەیە.

## نیشانەی هەشتەم:

توانج گرتن لە بڕواداری ڕاستەقینە، ئەوەندەی باسی مسوڵمانان دەکات، هێندە باسی جوولەکەو مەسیحی ناکات. هەروەها گاڵتە دەکات بە بڕواداران‌و بە مەبەستی توانج گرتن لاساییان دەکاتەوە.

## نیشانەی نۆیەم: گاڵتە کردن بە قورئان و سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ):

مونافیقان هەردەم گاڵتە بە قورئان و سوننەتەکانی پێغەمبەر دەکەن. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِؤُونَ(٦٥)لاَ تَعْتَذِرُواْ قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ﴾[ التوبه: ٦٥ـ ٦٦]، واتە: (ئەی پێغەمبەر! بەو مونافیقانە بڵێ: ئەوە بە خواو ئایەتەکانی خواو پێغەمبەرەکەی گاڵتە دەکەن؟! (بێ سودە) پاکانە مەکەن، چونکە ئێوە بێ باوەڕبوون دوای ئەوەی لە ڕواڵەت

باوەڕتان هێنابوو)عوزر دەهێننەوە، ئێوە پاش ئەوەی باوەڕتان هێنا بەم گاڵتەکردنە کافر بوون. جا خوای گەورە ئەم ئایەتەی لەسەر کۆمەڵێك مونافیقان ناردە خوارەوە، کە لەگەڵ پێغەمبەر نوێژیان دەکردو ڕۆژییان دەگرت و جیهادیان دەکرد، بەڵام لە کۆڕی (سەمەر)دا دادەنیشتن و یەکێکیان قسەی بە هاوەڵە بەڕێزەکان دەگوت، دەیگوت هیچ کەسێکمان وەك ئەو سەحابیانە نەدیوە، کە چاویان لەزگ پڕکردن و ترسنۆکی بێ، جا خوای گەورە ئەو مونافیقانەی بەکافر داناو ڕیسوای کردن.

گاڵتەکردن بە جلوبەرگو سیواكو ڕیشو هەیئاتو حەدیس، مرۆڤی پێ کافر دەبێ.

## نیشانەی دەیەم: سوێند خواردن بەدرۆ:

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿اتَّخَذُوا أَيْمَانَهُمْ جُنَّةً﴾ واتە: (مونافیقان سوێند دەکەنە پارێزگارو پاکانە بۆ درۆیەکانیان).

گەر داوای شتێك لەمونافیق بکرێ، یەکسەر سوێند دەخوا، ئاسانترین شت لای ئەو سوێندە، کە بەدرۆ بیخوا.
ئەبینی غەیبەتی یەکێك دەکا، غەیبەت کراوەکەش دەیبیستێتەوەو پێی دەڵێتەوە، کە ئاوات گوتووە، ئەویش دەڵێ: بەخوا ئەم قسەیەم پێ نە گوتوی. یان بەکەسێك دەڵێ بەخوا تۆ خۆشەویسترین کەسی لەلای من، کەچی لەڕاستیدا درۆ دەکاو سوێندەکەی دەکاتە پاکانە بۆخۆی.
هەروا نیشانەی مونافیقان ئەوەیە، کە لە هەموو خەڵك زیاتر سوێند بە درۆ دەخوات.

## نیشانەی یازدەهەم: ماڵ بەخشین بە زۆر:

مونافیق ماڵ دەبەخشێ، بەڵام بەدڵ پێی خۆش نیە، یان خێر دەکات، یان مزگەوت دروست دەکات، بۆ ناوبانگیەو لە دڵیەوە پێی ناخۆشە، بەڵام مسوڵمان کە ماڵ دەبەخشێ، سینگی فروان دەبێ‌و سوپاسی خوا دەکا.

## نیشانەی دوازدەم: بەکەم دانانی مسـولمانان:

لە نیشانەی مونافیقان ئەوەیـە، کـە مـسولمانان بـە کەمو سوك دەردەخات، هەردەم ڕەشبینن‌و دەڵێن کافرەکان لـە مـسولمانان بـەهێزترن. بەگاڵتـەوە دەڵـێن: ئایـا مسولمانان دەتوانن شەڕ لەگەڵ ئەمریکا بکەن کە خاوەنی چەکی ئەتۆمی‌و چەکی ئەتۆمییە؟ دەڵێ ناتوانن جـەنگیان لەگەڵ بکەن.

دەڵێن ئێمەی مسولمان هـەر لـە هیلاکـی‌و ناخۆشـی داین. بەڵام نازانن خوای گەورە بەندەکان سەردەخات، وەك دەفـەرموێ: ﴿إِن يَنـصُرْكُمُ اللّـهُ فَـلاَ غَالِـبَ لَكُـمْ﴾ [آل عمـران:١٦٠]، واتـە: (گـەر خـوا سـەرکەوتنتان پـێ ببەخـشێت، ئـەوا هـیچ کـەس ناتوانـێ سـەرکەوێت بەسەرتان)، هەروەها نـازانن کـە عیـززەت تـەنها لـەلای خوایە. هەروا لە نیشانەی مونافیق ئەوەیە، کە گوێی لەوە دەبێ گەنجان ڕوو لە جیهاد دەکەن، دەڵێ: پێم وانیـە بـچن بۆ جیهادکردن، یان گەر یەکێك ببینێ بڕوات بۆ (محاضـرة)

دەڵێ: باوەڕناکەم ئەم محاضرەیە سودی هەبێ، ئەمە هیچی تێدا نیە، تەنها ئەوە نەبێ: (اتقوا الله، اتقوا الله)، یان بە هاوڕێکانی دەڵێ: لەم دەرسانە ئامادە مەبن، لەبەر ئەوەی هەر دووبارەیە، پێویستە لەسەرت لەماڵەوە بمێنیتەوە کاتی خۆت بەفیڕۆ مەدە لەپێناو چەند شتێك، کە لە کتێباندا هەیە. ئەوانە هەمووی بەسەر شۆڕکردنو سووك کردنی مسوڵمانان دادەنرێ.

## نیشانەی سێزدەم: ڕووداو گەورەکردن:

خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿لَئِن لَّمْ يَنتَهِ الْمُنَافِقُونَ وَالَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ وَالْمُرْجِفُونَ فِي الْمَدِينَةِ لَنُغْرِيَنَّكَ﴾[الأحزاب: ٦٠] ، واتە: (ئەگەر دوو ڕووەکان و دڵ نەخۆشەکانو پڕوپاگەندە چیەکان لە مەدینەدا کۆڵنەدەن، مۆڵەتو هانی تۆدەدەین کە تۆڵەیان لێ بستێنین، (لەوەدوا زۆربەیان دەربەدەر بکەیت)و کەمێکیان نەبێ لە شەڕدا نەمێننەوە)، یەکێ لە نیشانەی مونافیق

ئەوەیە شتی بچووك گەورە دەكات، كە گـوێی لەكوشـتنی موجاهیدێك بیّ دەڵیّ: گوێم لیّ بوو كە (١٠:) موجاهید كـوژراوە، وەیـان گـەر گـویّ لەهەڵـەی زانایـەك بـوو لەمەسـئلەیەكی لابـەلایی دەڵـیّ: خـودا ئێمـەو ئـەویش هیدایەت بدات، هەڵەی زۆرە. یـان گـەر داعیـەك قـسەی كرد بـیّ ئـەوەی ئـەم داعیـە بـە مەبەسـت، یـان تـوانج قسەبكات، ئەوا ئەو كەسە دیّ لـەناو مـەجلس دا باسـی دەكاو دەڵیّ: گوێتان لیّ نەبوو فلاّنە كەس چی گووت، كـە چی ئەو داعیە زۆر چـاكە و فـەزلی هەیـە، بـەلاّم باسـی ناكات.

## نیشانەی چواردەم : ڕەخنە گرتن لەقەدەری خوا :

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ قَالُواْ لإِخْوَانِهِمْ وَقَعَدُواْ لَوْ أَطَاعُونَا مَا قُتِلُوا﴾[آل عمران:١٦٨]، واتـە: (ئەوانـەی بۆی دانیشتن و نەچوون بۆ جەنگ بـەبراكانی خۆیـان ووت: ئەگەر ئەوانە، واتە (شەهیدان) بەقسەی ئێمەیان بكردایـە

نه دەکوژران ئەی پێغەمبەر(ﷺ)پێیان بڵێ: دەی کەواتـە مردن لەخۆتان دووربخەنەوە ئەگەر ڕاست دەکەن).

لەوکاتەی مسوڵمانەکان دەچوون بـۆ جـەنگی ئوحـود، مونافیقەکان پێیان گـوتن دەرمەچـن و جـەنگ مـەکـەن، لەگەڵ ئێمە دانیشن، بەڵام مـسوڵمانەکان چـون و شـەهید بوون. جا مونافیقەکان لە مەجلیس دا دەیان گـوت ئێمـە ئامۆژگاریمان کردن و پێمان گوتن، بەڵام بەقسەی ئێمـەیان نەکرد، ئەگینا نەدەکوژران، لەبەر ئەوەی مونافیق هـەردەم ڕەخنەدەگرێ و بەقەدەری خوا ڕازی نیە، ئەگەر ناخۆشی و بەڵایەکی تووش بوو، دەڵێ: ئەمە چۆن دەبێ، گـەر مـن ئاوام بکردایە، ئاوا دەبـوو، لۆمـەی خـەڵك دەکـا. بـەڵام ئیمانـدار دەڵـێ: بـڕوام بـەخوا هێنـاوەو ملکەچـی فەرمانـەکانیم. بـڕوادار دەزانـێ هەرشـتێك بەسـەری دێ بەقەزاو قەدەری خوایە. لەکتێبی ئیمام موسلم دا هـاتووە لـە سـوهەیبەوە، کـەوا پێغەمبـەر(ﷺ)فەرموویـەتی :
((عجبا لأمر المؤمن إن أمره كلـه خير، إن أصـابته سرّاء

فشكر كان خيرا له وإن أصابته ضرّاء صبرو كان خيرا له وليس ذلك إلا للمؤمن)).واتە: (كاری مسولّمانان مایەی سەرسوڕمانە، هەمووكاروباری خێرە گەر تووشی خۆشی بوو ، سوپاسی خوا دەكات، كەئەوەش بۆ ئەو خێرە، گەر توشی بەڵاو ناخۆشی بوو، ئارام دەگرێ، ئەوەش بۆ ئەو خێرە، ئەوەش تەنها بۆ بڕواداره

## نیشانەی پازدەم: بەخراپە باس كردن و زمان لێدان لە پیاوی باش و چاك.

ئەم جۆرە سیفەتە وەك غەیبەت وایە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿سَلَقُوكُم بِأَلْسِنَةٍ حِدَادٍ أَشِحَّةً عَلَى الْخَيْرِ﴾[الأحزاب:١٩] واتە: (گەر شەڕو ترسیان لەسەر لادرا ئەوە ئازارتان دەدەن بەقسەو زمانێكی بڕەری تیژی وەك ئاسن).

جا مونافیق گەر پشتی لەبڕواداری سالّح كرد، ئەوا بەزمانێكی تیژی وەك شمشێر باسی دەكات. گەر بڵێ

ڕەئیت چۆنە بەرامبەر بە فلآنە کەس، دەڵێ: خوا لە ئێمەو ئەویش خۆش بێ، جا ئەم دوعایە دەکات، کە مەبەستی شتێکی ترە، ئەیش خوا دەزانێ.

## نیشانەی شازدەم: دواکەوتن لەنوێژی جەماعەت:

لەئیبن و مسعودەوە کەوا پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((وما يختلف عنها إلا المنافق معلوم النفاق))أخرجه مسلم، واتە: (کەسێك لەنوێژی جەماعەت دواناکەوێ، مەگەر مونافیقێکی دیارو ئاشکرا بێ). جا گەر یەکێکی لەش ساغ وبەهێزو دەست بەتاڵ عوزری شەرعی نەبێ، گوێی لەبانگ بوو و نەچوو بۆ مزگەوت، ئەواشایەتی لەسەر بدە کە مونافیقە.

## نیشانەی حەڤدەم: بڵاو کردنەوەی خراپەکاری بەناوی ئەوەی کە چاکە دەکات:

خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ لاَ تُفْسِدُواْ فِي الأَرْضِ قَالُواْ إِنَّمَا نَحْنُ مُصْلِحُونَ(١١)ألا إِنَّهُمْ هُمُ الْمُفْسِدُونَ وَلَكِن لاَّ يَشْعُرُونَ﴾ [البقرة: ١٢،١١]، واتە: (ئەوانە کاتێك پێیان دەوترێ تۆوی گوناهو تاوان و گوناهکاری خراپە کاری مەچێنن لەزەویدا دەڵێن: بەڕاستی ئێمە چاکسازی دەکەین!! ئاگادارین بەڕاستی هەر ئەون تۆوی خراپەکاری دەچێنن، بەڵام بەهۆی لوت بەرزی و دەردەدارییانەوە هەستی پێ ناکەن و خۆیانی لێ گێل دەکەن).

لە رووکاری ئەم نیشانە ئەوەیە، دەبینی یەکێك هەوڵی ئەوەدەدا نێوانی خەڵکی تێك دەداو دووزمانی دەکات، یان شایەتێکی بەدرۆ دەدات بە خراپەکاری، جا گەر پێ ی بڵێی فلاّن کەس! بۆ لەخوا ناترسی ئەم کارە دەکەی؟

ئەویش دەڵێ: بەخوا دەمەوێ چاکەکاری و ئیصلاح بکەم، کەچی لەدڵیدا مەبەستی فەساد بڵاو کردنەوەیە.

## نیشانەی هەژدەم: ناوەوە و دەرەوەی (ظاهرو باطنی) وەك یەك نەبێ:

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِذَا جَاءَكَ الْمُنَافِقُونَ قَالُوا نَشْهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ اللَّهِ وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُ وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَكَاذِبُونَ﴾[المنافقون: ١]، واتە: (ئەی پێغەمبەر(ﷺ) کاتێك ناپاك و دوورووەکان دێن بۆلات و پێت دەڵێن: ئێمە شایەتی دەدەین کەتۆ پێغەمبەری خوای!! لە حاڵێك کە خوا چاك دەزانێ کە تۆ پێغەمبەر و فرستادی ئەویت، لەهەمانکاتدا، خواشایەدی دەدا کە ئەو ناپاك و دووڕوانە درۆزنن.

مونافیقان ئەوانە بوون کە بەڕواڵەت باوەڕیان بە پێغەمبەر هەبوو، دانیان بەڕاستی دا دەهێنا، بەلام لەناوەوە (باطن) ڕاستیان نەدەکرد، جا خوای باڵا دەست،

بەدرۆی خستنەوە، شایەتیە ڕاستیەکانی ڕواڵەتەکانیان کەیان خستینە ناو دۆزەخ.

لەبەر ئەوە هەرکەسێك بەم جۆرە خۆی دەرخات واتە: ظاهر و باطنی وەك یەك نەبێ، ئەوا ئەم نیشانەی لەسەر دێتە دی.

## نیشانەی نۆزدەم: ترسان لە شت ڕوودان:

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿يَحْسَبُونَ كُلَّ صَيْحَةٍ عَلَيْهِمْ﴾[المنافقون: ٤]، واتە: (ئەوەندە لەترس و بیمدا دەژین هەر هاوارو بانگێك بكرێت، هەر باسێك بێتە پێشەوە وادەزانن دژی وانە).

ئەو جۆرە كەسانە هەردەم دەترسن شتێك ڕووبدات، جا ئەگەر نرخی شتومەك بەرزبۆوە، لە كۆڕو مەجلیساندا دەگریو دەڵێن: ئەرێ گوێتان لێ نەبوو نرخی برنج و شەكرو....هتد، چۆن بەرزبۆتەوە، ئەو كەسانە تەنها خەمی زگیانەو گوێ نادەن بە بانگەوازییو سەركەوتنی

ئیسلام و فەرمان بەچاکەو قەدەغەکردنی خراپەکاری، لە هەر شوێنێك شتێ ڕووبدات دەترسن، گەر مەیدانی جەنگ بە هەزار کیلۆمەتر لێیان دووربێت لەترسان دەلەرزن، بەڵام مسوڵمان نەفس و گیانی خۆی بەخوا فرۆشتووە لە مەیدانی جەنگ پێدەکەنێ.

## نیشانەی بیستەم: عوزر هێنانەوە بەدرۆ:

لەو کاتەی پێغەمبەر ﷺ ویستی جەنگ لەگەڵ بەنی الأصفردا بکات لە جەنگی تەبوك، بە (جدی کوڕی قەیس)ی گووت کە لە گەورە پیاوانی (بنی سلمە)بوو، وەرە لەگەڵ ئێمە دەرچە بۆ جیهاد کردن. بەڵام ئەو بە پێغەمبەری ﷺ گووت: من لەخۆم دەترسم لە فیتنەی ئافرەتانی (بەنی ئەصفەر). جا ئەم جۆرە عوزر هێنانەوە نیشانەی مونافیقی یە.

## نیشانەی بیست و یەکەم: فەرمانکردن بەخرا پەو قەدەغەکردنی چاکە:

خــوای گــەورە دەفــەرمووێ: ﴿الْمُنَـافِقُونَ وَالْمُنَافِقَـاتُ بَعْضُهُم مِّن بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالْمُنكَرِ وَيَنْهَـوْنَ عَـنِ الْمَعْـرُوفِ وَيَقْبِـضُونَ أَيْـدِيَهُمْ﴾ [التوبــە: ٦٧] ، واتــە: (دووڕووەکــان لــەپیاوان و ئافرەتــان ســەربەیەکترن وەك یــەکن لــەم ڕەفتارانــەدا: فرمــان بــەگوناهو خراپــەو تــاوان دەدەن قەدەغەی چاکە دەکەن و دەستیان دەنوقێنن(ماڵ و سامان بەشی کەس نادەن)).

جا ئــەو جۆرەکەســانە دەیانــەوێ خراپــەکاری و زینــاو بەڕەڵایی و واز هێنان لە حیجاب بڵاو ببێتــەوە وگــۆرانی ناشەرعی و گۆڤاری ئافرەتی ڕووت و تریاك و هیرۆیین بڵاو ببێتەوە، کە ئەمانە هەمووی (منکر)ەو، دەیانەوێ خێــرو زانیاری وبانگەوازی کەم ببێتەوە. جا دەبینــی خــەڵکی وا هەیە پێی دەڵێی: خوا وادەفــەرمووێ و پێغەمبــەر ئــاوای

دەوێ، ئەویش دەڵێ: برام لێمان گەڕێ ئێمە دەزانین دین چیە و دین شارەزاین.

## نیشانەی بیست و دووەم: دەست گرتنەوە بە مەبەستی ڕەزیلی.

مونافیقان لەهەموو کەسێ ڕەزیل و بەخیل ترن بۆ خێرکردن. ئی وایان هەیە دەبینی بۆ دەعوەتێکی نانخواردن شەست ئاژەڵ سەردەبڕێ بۆ ناوبانگ دەرکردن، بەڵام گەر داوای بەخشینی ماڵی لێ بکەی بۆ خێرکردن و بۆ جیهادکردن، یان بۆ پرۆژەیەکی خێر ئەوا(١٠)دینارێکت بۆ دەر دێنێ. خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَيَقْبِضُونَ أَيْدِيَهُمْ﴾[التوبە:٦٧]، واتە: (دەستیان دەنوقێنن لەماڵ و سامان بەشی کەس نادەن).

## نیشانەی بیست و سێیەم: خوا لەبیر چوون:

سیفەتی مونافیقان ئەوەیە، باسی هەموو شتێك دەکەن، تەنها باسی خوا ناکەن، باسی خێزان و منالّەکانیان دەکەن و باسی گۆرانی و ئاوات و هەموو شتێك لە ژیانی دنیا دەکەن، تەنها خوا نەبێ. جا خوا لەبیر چوون گەورەترین بەلآیە مونافیقان توشی بوون،خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿نَسُواْ اللّهَ فَنَسِيَهُمْ﴾ [ التوبە: ٦٧] واتە: ( ئەوانە خوایان فەرامۆشکردووە، خواش ئەوانی پشت گوێ خستووە).

خۆشەویستانی خوا هەردەم خوایان لەبیرەو یادی خوا زۆر دەکەن، بەلآم مونافیق یادی خوا کەم دەکاو خوای لەبیر دەچێ خوای گەورەش ئەو کەسە پشت گوێ دەخا.

## نیشانەی بیست و چوارەم: بەدرۆخستنەوەی بەڵێنی خوا و پێغەمبەر(ﷺ):

خوای گەورە لەسەر زمانی مونافیقانەوە دەفەرمووێ ﴿مَّا وَعَدَنَا اللَّهُ وَرَسُولُهُ إِلَّا غُرُورًا﴾ [الأحزاب: ١٢] واتە:(بەڵێنی خواو پێغەمبەرەکەی تەنها بۆ هاندان بوو(کوا هیچ هاتەدی؟!)).هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە ئەوەبوو، کەپێغەمبەر (ﷺ)لەجەنگی ئەحزاب لەکاتی هەڵکەندنی چاڵ ئامادە بوو، لەو کاتە دا یەکێك لەو چاڵانە بەردێکی کەوتە بەر کە نەدەهاتە دەرەوە، پێغەمبەر بە قازمەیەك چووە ناو چاڵەکەو بە قازمەکە لەبەردەکەی دەدا، تروسکەی لێ پەیدا دەبوو، دووبارە لێی دەدا تروسکەی لێ پەیدا دەبوو، فەرمووی دووگەنجینە سوورو سپی یەکە دەبێتە موڵکی ئوممەتی من. مونافیقەکان لەدەوری چاڵەکە بوون و دەیان گووت: تەماشاکەن بەڵێنی گەنجینەی کیسراو قەیسەرمان پێ دەدا

لـە حاڵـەتێکی وادا، کـە هیـچمان لەترسـا نـاوێری میـز بکات. ئەوەش یەکێکە لەسیفەتەکانی مونافیقان.

## نیشانەی بیست و پێنجەم: گرنگی دان بە ظاهر و فەرامۆش کردنی باطن:

موناقیقان دەبینی جل و بـەرگیان لەڕواڵەتـدا جوانـە، بەڵام ناوەیان خراپ و (فاسید)ە. ئێمە نالێین خۆت پـشت گوێ بخە لە جوانی و لەجل وبەرگ، بەڵکو دەبێ مسوڵمان خۆی بۆن خۆش بکا و جوان ترین جل و بـەرگ لەبـەربکا، لەگەڵ ئەوەش دەبێ نـاوەوەی خـۆی جـوان بکـا بـەزیکرو چاودێری کردن و دڵسۆزی و ڕاست گـۆیی لەگـەڵ خـوادا، تاجوانی ڕواڵەت و پاکی ناوەوە یەك بگرێتەوە.

## نیشانەی بیست و شـەشەم: شـارەزا نەبوون لەدین:

ئەوەی کە مونافیقانی پێ جیادەکرێتەوە، بریتی یە لـە شـارەزا نـەبوونیان لـە دیـنو لـە هـیچ شـتێك، دەزانـێ ئۆتۆمبێل چۆن کاردەکا، یان دەزانێ دەوڵەتەکانی جیهـان پایتەختەکانیان ناویان چیە، بـەڵام گـەر لـەبارەی دینـەوە پرسیاری لێ بکەی هیچی لێ نازانێ.

هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَكِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَا يَفْقَهُونَ﴾[المنافقون: ٧]، واتـە: (دووڕوەکـان ئـەم ڕاسـتیە تێناگەنو لە ڕاستیەکانی سەر دەرناکەن).

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((من یرد الله بەخیرا یفقـه في الدین)) رواه البخاريو مسلم. واتـە (هەرکەسـێ خـوا چاکەی بۆی بوێ، لەدین شارەزای دەکات. نیشانەی بڕوادار ئەوەیە کە خۆی لە دین شارەزا دەکا، هـەردەم هـەوڵ دەدا شتێك سوودو خێـری تێـدابێ ئـەنجامی بـدات. مونـافیق حەزناکات لـە کـۆڕو دانیـشتندا باسـی عیبـادەتو نوێـژ

بکـریێ، وادەزانـێ بـەزمانێکی تـر قـسە دەکـەن و پێـی ناخۆشە باسی ئەم بابەتانە بکریێ.

## نیشانەی بیست و حەوتەم: دڵ خۆش بوون بە هاتنی بەڵاو ناخۆشی بەسەر بڕواداران و غەم و پەژارە دەربڕین بە خۆشی ئیمانداران:

خوای گەورە دەفـەرموێ : ﴿إِن تُصِبْكَ حَسَنَةٌ تَسُؤْهُمْ وَإِن تُصِبْكَ مُصِيبَةٌ يَقُولُواْ قَدْ أَخَذْنَا أَمْرَنَا مِن قَبْلُ﴾[التوبە:٥٠]، واتە: ( ئەی پێغەمبەر! ئەگەر توشی خێرو بێرێك ببی، ئەوا پێـی د ڵتەنگ و سـەغڵەتن، خـۆ ئەگەر تووشی بـەڵاو ناخۆشـی ببی دەڵێن ئێمـە پێـشتر حیسابمان بۆخۆمان کردبوو). جا مونافیق گەر گوێی لـەوە بوو یەکێك لە مـسوڵمانان تووشـی بەڵایـەك بـووە، ئـەوا بڵاوی دەکاتەوە و خۆی وا پێشان دەدا کە پێی ناخۆشـە و پێی بە ئازارە بەهاتنی ئەم بەڵایـە، بـەڵام لـە دڵ دا پێـی

خۆشە، ئەگەر خۆشی و شادی یەکیان تووش بوو، بەمە تورە و دڵ گران و سینگ تەنگ دەبێ.

## نیشانەی بیست و هەشتەم: زمان لوسی و زۆروەڕیی:

قسە قەڵەو و بێ مانا و قسە کردن بە لووت بەرزی سیفەتی مونافیقانە، و هەردەم پێیان خۆشە لەسەرەوەی خەڵك قسە بکەن، قسەی وادەکەن کە خەڵك پێیان هەڵ خەڵەتێ. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَإِن يَقُولُوا تَسْمَعْ لِقَوْلِهِمْ﴾[المنافقون: ٤]، واتە: (کاتێکیش دێنە قسە( ئەوندە دەمبازوو قسەزانن)گوێیسان بۆ دەگری)هەروەها پێیان وایە کە ئەوان لەخەڵکی تێ گەیشتووترن و عاقڵ ترن لەڕاستیدا ئەم سیفەتەشیان تێدانیە.

## نیشانەی بیست و نۆیەم: شەرم کردن لەخەڵك و لەخوا شەرم نەکردن:

ئەم نیشانەیە گرنگترین نیشانەیە بەجیا کردنەوەی مونافیق لە ئیمان داران، کە لەبەردەم چاوی خەڵك گوناه ناکا، بەڵام کە خەڵك دیار نەبوو، ئەوا خەراپە و گوناه دەکا، خوای گەورە بەکەمترین کەس دادەنێ بۆ بینینی. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿يَسْتَخْفُونَ مِنَ النَّاسِ وَلاَ يَسْتَخْفُونَ مِنَ اللّهِ وَهُوَ مَعَهُمْ﴾[النساء:١٠٨ ]، واتە: ( بەڕاستی ئەوانە شەرمەزارن بەرامبەر خەڵکی و خۆیان دەشارنەوە، بەڵام شەرم لەو خوا ناکەن، کەهەمیشە لەتەکیانەو چاودێریانە)، بەڵام بڕوادار، خوای خۆی بە چاودێر دادەنێ لەسەر نەفس و دەروونی خۆی لە نهێنی و ئاشکرادا.

## نیشانەی سی یەم:

ئەگەر لەگەڵ یەکێك ناکۆکی کەوتە بەینی، زیادە ڕەوی بکات لە گوتنی قسەی ناشرین پیی، هەموو شتێکی خراپەی لەگەڵ بەکاربهێنی. پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمێ : ((وإذا خاصم فجر)) واتە: (کە دژایەتی کرد، خراپەی زۆر بەرامبەرەکەی دەکات) ئەم فەرموودەیە لە صەحیحین دا هاتووە، ئەهلی عیلم فەرموویانە هەرکەسێك لەگەڵ مسوڵمانێك دژایەتی یەکی پەیدا کرد نالێین لەگەڵ کافر، چونکە دژایەتی کافران بابێکی ترە، پاشان بەو شێوەیەی کەلەسەرەوە باس کرا ڕەفتاری کرد، ئەوا خوای گەورە شایەتە لەسەر دڵی کە مونافیقە.

لەخوای گەورە داواکارین لەم نەخۆشی یە بمان پارێزی و ئاگادار بین لەم نیشانانە.

# ناوەرۆك

